لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی–
لقی کەرکووک
دیاری رۆژنامەی سێبەر - 3

# خەمەکان
# لە ناخی منەوە چرۆ دەکەن

شیعر

فەهد شوانی

2005

* خەمەکان لەناخی منەوە چرۆ دەکەن

* شیعر

* فەهد شوانی

* تایپ: سەراب

* هەڵەچن: خالید عەبدول

* دەرهێنانی هونەری و بەرگ: فەهد شوانی

* دیاری رۆژنامەی سێبەر – 3

* چاپی یەکەم – 2005

* تیراژ: 500 دانە

* چاپخانەی ئارابخا– کەرکوک

**Fax: 001 413 669 6427**
**E-mail:  fahdshwani@yahoo.com**

**www.fahdshwany.i8.com**
**www.fahdshwani.i8.com**

## پێشکەشە..

- بە دایك و باوك و خوشك و براکانم..

- بەو خەمانەی تابلۆی تەنیاییم دەشێوێنن و لەبەرامبەردا پێکی رۆحم دەخۆنەوە..!

- بەو سەرابەی هێند بۆی گەڕام و نەمبینییەوە.. تا خۆم ون کردو بووم بە سەراب..!

# پێڕست

لەم دوورگە ونەدا

توولەڕێیەکان هێند ناسك بوونەتەوە

بەرگەی شوێن پێیەکانم ناگرن,

درز دەبەن..

ئەی هەورە کۆچەرەکان

ئیدی توانای ڕێکردنم نەماوە.

کوا پاییزی تەمەن,

بۆ نایەت و..

لە سێبەری خۆما دەرمبێنیٚ,

تاکەی لە سێبەری خۆما دیل بم..؟!

ئەوە زەمەنێکە لە دەریا یاخی بوومە,

نامەویٚ ئەو دیمەنانەم بیربێتەوە.

بۆ قومیٚ ئاو سەدان چڵە نێرگز

لە بیابانا بوون بە درٍکەزی..!!

خۆم لە باران شاردۆتەوە

بەسە چیدی با بەتەرٍی ریٚ نەکەم..!

چون شوێن پێیەکانم ناناسرێنەوە..

خۆ دوا مەنزڵگای ژینم هێندە دوورە,

نەک مەرگێک..!

چەندان مەرگ کۆکەمەوە

هەر نایگەمیٚ..!

ئیدی ئەو هەموو رێکردنە بۆ..؟!

ئەو شەوەی بەفر باری

لە سێبەرە زیندانەکەمدا

دڵم سووتا,

هەر شوێن پێیەکی هەناسەم ئازارێکەو

برینەکەی وا لە رۆحما..

ئاسمانی زەمەنی رێکردنم

لەو دیو سنووری گەردوونەوە

پاییزە ئەستێرەی ئاوارەبوونێکی دی لێدەڕژێ..!

لە پرسەی عەشقە ناکامەکانی رێکردنا

ئاوارەیی دوا گۆرانییەو

چرکەکانی خیانەت دەیچڕن..!

دەریا بە گومانە

لە جووتبوونی ماسی و شەپۆل

کاتیش بڕوا بە شێتبوونی چرکە ناکا..

وەلێ تووڵەڕێیەکان بێ بەرین

لە ئاوابوونی ماچ..!



ئاخ بۆ ئەو ساتەی یەکەم پێکی شەرابم نۆشی!

وام دەزانی ئیدی تەنیایی رۆحم ناخواتەوە..

کە مەست بووم,

لەنێو فنجانێکی کریستاڵدا دەکەومە مەلەو

فاڵچییەك دەمبینێتەوە..!

وەلێ ئەو فاڵچییانەی مەبەستیان بوو بمبیننەوە,

ئەمێستا بەدوای خۆیاندا وێڵن..



بۆ دۆزینەوەی لاوێتیم,

دەبێ بۆ ئەو پێکە شەرابە بگەڕێم

کە چەند ساڵە

لەدووتویێ رۆمانێکدا

چاوەڕێمەو چاوەڕێم..!

تا بە تووله‌ڕێی تەمەنا هەنگاو بنێم,

ئەو شەرابە ئاڵتر دەبێ..

تا ئەو شەرابە ئاڵتر بێ,

ڕۆحیشم لەنێو مناڵدانی مناڵییا

مناڵتر دەبێ..!

تا ئەو شەرابە بەمن دەگات,

بەدەم ڕێکردنەوە

هێند پێکی خەم دەنۆشم,

لەمەستیا جارێکی تریش ون دەبم..

کاتێ دەمبینێتەوە

بەدیمەنی مەستی من

حەزی مەستی دەخرۆشێ و

خۆی دەنۆشێ..!

منیش کاتێ دەگەم بە ئەو

گەردوون لە بێ هەواڵیما گیانی داوە..

تەمەن لەخۆی وەڕز بووە..

توولەڕێیەکان بە وێستگەی  فەنابوون گەیشتوون..

منیش تاقەتی خۆ دۆزینەوەم نەماوە..!!

کە منالْ بووم,

هەناسەم ساباتی جۆگەلە بوو,

تا تیشکی هەتاو

ماسییە ئەوین پەرستەکان نەسوتێنێ..

کە منالْ بووم,

شەوان دەچوومە جەستەی هەورەوەو

لەگەلْ باراندا جووت دەبووم،

ئیدی فریشتەکانی گوناهـ دەتۆران و

خەونەکانم سەوز دەبوون..

دواتریش هەر بە مناڵی

قەدەر گەورەبوونی لێ مارەکردم..

ئاسمانی دەڤەری من

لە بەستەڵەکی شاری گڕ جێماوەو

ئەمێستا کلو کلو دێتە خوارێ،

ئێرە دارستانی ڕەژووە..

ئێرە هەسارەیەکی نەوسنە..

دەشێ پێش لە دایکبوونی ئادەم و حەوا

مناڵێکی بزێو

بۆ ناشتنی تەرمی وەریوی ماچێ

چێی کردبێ..

پێدەچێ چۆلەکەکانی ئەم دەڤەرە

زۆریان ئەنفالی زایەڵە بینیبێ

بۆیە پرسیار دەکەن:

ئێمە دڵۆپێکین لە سێبەر

یا سێبەر هەناسەیەکی وەریوە لە ڕۆحمان؟!

دیمەنێکی سەرابییە،

بوونە ناکۆتاکان

رۆڵی مردوویەک دەبینن,

کە چەشنی ترپەکانی دڵم

بەردەوام لە مەرگدان!

حەوت ساڵ، بەردەوام دەڕۆیشتم

تا بە ئینجانە ئاڵەکانی ئەو دیو سنوور بگەم,

وەلێ کە خەبەرم بووەوە

لە شوێنی خۆم:

(یەک - دوو)م دەکرد..

چ کارەساتێکە,

رۆحم بووە بە هەنسک و

هەنسکم بە یادگاری..

لەودیو بازنەی داخراوی بوون

سۆزانییەک،

نەسیمی رۆحم دەبرژێنێ..

قەرەجێک،

وێنەی مەستیم دەکێشێ..

شارێک،

بۆ كۆڕەوی هەناسەم دەبێ بە هەڵم..

زۆر نیگای شكاوی ئاوێنە

لە چاومدا گیرسانەوە

بۆ بوونە سێبەری تەمەنم

دوا گۆرانی پیریمیان چڕی..

تێر تێر بۆنی رۆحیان كردم و

بۆ نامۆیی پاییز گەڕانەوە..

كچۆڵەیەك هێندە بۆ ئامێزم گریا

زەریا شینی بۆ ئاسمان ناردەوە,

ئەستێرەكان لە شینیدا خنكان,

هەورەكان دڵیان تێكچوو،

هێڵنجیاندا،

پەپوولەكان تێكڕا شین بوون..

لە وڵاتی ژیلەمۆی رەنگەكان،

تابلۆكانی كەنار مێژوو

بۆ سووتانی پەنجەرەی شەراب و

پێكی ئایندە،

ئاوازی گریان دەژەنی..

لە ئەفسانەی باراندا

بە بەرچاوی گریان و رەهێڵەوە

ساباتی خۆزگەکانم

لەنێو شەپۆلی دەریادا

بوون بە قەقنەس..

لەم وەرزەدا،

کەس خەو بەجوانییەوە نابینیٚ,

لەگەڵ بلاجکتۆرەکانی سەر شەقام و

گڵۆپە سەوزو سوورەکانی ژوورەکەم

فانۆس دڵی شەوم بۆ لەت دەکا،

لەتێکی لە توونێلی سەرابا دەخنکیٚ و

لەتەکەی تریش

باران رەنگی دەگۆڕیٚ..

لە خێزانی کوکوختییەکان

کەس بۆی نییە سبەی بژی..

ئیدی چ پێویست دەکات

ئیمڕۆ لە یاداشتەکانی ئاوا بتوێتەوە..؟

لە قەراغ دیسکۆیەکی ئەودیو سنوور

کات، خۆی رووت کردبووەوە
ئەو زەردەپەڕەی،
شۆخێکی جوان
ساتەکانی تەنیایی پێ ناساندم،
نیگای بێ لانەم گریا،
تەنیاییم بوو بە هاودەمی رەهێڵەو
ئیدی لە تەنیایدا کۆچی کرد..
کچێک خۆشی دەویستم
وەلێ کە زانی ئاوارەم,
لە شیعرێکی یاخییا
بۆی نووسیبووم:
(من نامەوێ ببم بە یاری قەرەجێ..!)
نساری دڵم وەرزبووە
لە تیشکی چاوە رەشەکانی,
چرکە گورگینەکانی کاتژمێرەکەم،
ئیدی گوێ لە قەتارو ئەڵلا وەیسی ناگرم..
باڵندەکان هەموو لەیەک دەچن..
هەمدیس ئاسمان تووڕەی کردم

هەر دوای فڕینی کۆترەکان،

دەستی کردەوە بە شوشتنەوەی رووبارەکان،

هێدی هێدی مانگ سڕ دەبوو,

پاییز هات و ئاو هەڵوەری..

لەم سەرابستانی گەڵایەدا

رۆژگار گالیسکەیەکی بەکرێ گرتووە

تا پەیامی خۆکوشتنی سارێژ

لە لوتکەی ژانەوە

بگەیەنێتە پێدەشتی زامەکان،

گەر بیەوێ سەرێکی تریفەش بدا

دەبێ شەوێک لە ئارایشتگای پیری بمێنێتەوە،

کە خەبەری دەبێتەوە

زەوی چاوی رشتووە..

دڵێکم لە خۆڵ دروست کردووە,

ئەوەتەی بیرم دێ

ئاوازی ترپەم بۆ دەژەنێ..

لێرە بارانیش دروست دەکرێ..!

بە تێپەڕبوونی ئێوارەیەکی نارنجی

پەپوولەیەک حاشای لە هاوڕێیەتی کات کرد،

گەر بیرم بێ، منیش

بیست و شەش ساڵی تەمەنم

بە پێکێ مەی و

ماچی کچێک

گۆڕییەوە،

کەچی زۆر دڵخۆش بووم,

چوون تەمەنی من هەمووی سروود بوو..!

گەردەلوولە بەهارییەکان

بەدەم روانینی ئازارە هەڵواسراوەکانی ئاسمانەوە

دڵیان بردم بۆ جۆلانیێ..

چەپکە نیگای نامۆیی

جەستەی گوڵینی مناڵیمیان

شەلاڵی حەسرەتی دابڕان کرد

رێژنەی گڕی تەنیایی

خەندە پەرتەوازەکانی لێویان وشک کردم..

لە دیسکۆیەکی کەنار خۆزگە تاساوەکانم

بۆ هەرەس هێنانی زەمەن

دوا چرپەی تەمەنم نۆشی..

لە سێبەری وەرزێکدا

بەدەم درکاندنی رازەکانی پەیامەوە

باوێشکم دەدا،

* * *

هەناسەم بووە بە بیابانی جریوەو

تەرزی رۆحم لە ئامێزی گەلأدا

لە بێ رەنگیبا کاڵتر دەبێتەوە،

ئیدی دەستەکانم

باڵی زەمەن ناگرن،

ئیدی پێیەکانم

پێش فڕینی سەراب ناکەون..

پرچی سپی خۆرەتاو

بەم کازێوە درەنگ وەختەی گەڕانەوەم

تک تک مەرگ

دڵۆپ دڵۆپ خۆشەویستی,

چەند داوێکی لانەوازەش

ڕۆژانە بەسەر کاروانی پەشیمانییا

تۆفانی ئەستێرە دەبارێنن..

لەدوا بەهاری سەفەری ئاو

گوڵە سەرابێك ماچی کردم..

لەکەناری ویژدانەوە

فرمێسکی ڕۆحیم نۆشی..

چوون ڕێبوارە مۆمیاکراوەکان

لەگۆڕی یادو

گۆڕستانی ڕۆحیان

ناشتبوومیان..

خەمە ئاڵەکانی خەیاڵم

هەواریان لەدەڤەری چرکەدا هەڵداوە,

تا لە پێش تەمەنا

بە هێشوە فریشتەی پاییز بگەن,

نەبادا گەردوون تل بخواو

پاییز بە رووتی بکەوێتەوە ژێرییەوە..

زەردەپەڕی ئیمڕۆ

کەرنەڤاڵی ماڵئاوایی سەدە شەرمەزارەکانی

بیرهێنامەوە..

دوای بیست و شەش ساڵ

مردن لەگەڵ خەما,

سبەینێیەک لە مەلە یاخی بووم و

لە باخچەی بلێسەدا

لەگەڵ زەردەپەڕدا ئاشتبوومەوە..

رۆژگاری راوچی گزنگی ئایندە

چی چۆلەکەی رەشی تەنوورخانی هێڤیم هەیە

لە نەخشەی سەمای ئاوێنەدا

بەرەو کوانووی وەرینی خۆر هەڵیفڕاندن..

شەوێک بە ئێشکگری بوونی دەریایەکەوە مانەوەو

شەوی دواتر

لە ژوورە شێتخانەکەم

هەر کە...

پێکی شێت و

شیعری شێت و

پەنجەرەی شێت و

دراوسێی شێت و

میوان و خانەخوێی شێتیان ناسی..

چیدی بەرگەی خۆخواردنەوەیان نەگرت,

بوون بە فەرهەنگی شێتەکان..

ئاسمان بەدەم سەماوە

دڵی لەرزی،

سەمفۆنیای تارماییەکانم

لەژێر بارانی چەترەکاندا بیست و

هاژەی تەنیایم

لەپیاسەی سینەی تاڤگە ساباتییەکانەوە

ناسی و

لە فیردەوسی ئاوابوونی منالیمەوە

ژاکام و

لە نووکتە مەستەکانی قەدەرەوە

ئاوارەبووم..

ئەوەتانێ تابلۆی سەوزی یادەکانم

لەنێو چاوی سارێژی رۆحدا قەتیسماون..

ناخم بووە بە بورکان و

تەمەنم قوڵپ دەدا,

چرکەی دووجار

لەژێر کرێوەی تەنیایمدا

رۆدەچمە رۆحی خاکەوەو

بەفر ئاسا بەدەم سەمای مەرگەوە

لەسەر سینەی پێکێکدا

دەتوێمەوە..

کەرکووک– 2004

بۆ بوونی من
شەوگار لە ناخی بەردەوە هەڵدەقوڵیٚ..!
زریان ناسنامەی گەڵێکە
رەنگیان لە رەنگی خۆر دەچیٚ..!
*
چەند چرکەیەك لەمەوپێش
سنوورم لیٚ ون بوو بوو,
بەدوایدا دەگەڕام..
کەچی ئەمێستا بۆ خۆم سنوورم..!
هەسارەیەك لێوی بە لێوی کانییەکەوە نا
لێوی کانییەکە ئاو بردی و

هەسارەکەش لەنێو گەردەلوولێکی خەنەییدا
بوو بە تابلۆی گوندە رووخاوەکان..
ئیدی لەو رۆژەوە
لەگەڵ هەناسەی باراندا ئاوێتەم و
خووم بەسێبەری هەورەوە گرتووە..
لە ژێر گەڵایەکدا دەنووم،
لە هەر شوێنێکیش هەوار هەڵدەدەم
ئاوارەیی دەمخواتەوە..!

* *

چ کارەساتێکە,
لە مەرگ و ژیانی خۆت بە گومان بیت؟!
دەبێ ئێستا بەسەر لاشەی گاشە بەردێکەوە
نەمردبێتم..؟!
ئەی دەبێ ئێستا بەدەم شەپۆلێکی وێڵەوە,
لە نێرگزەجاڕی بیابانێکدا زیندوو نەبم..؟!
بۆنا.. پێدەچێ هەردووکیان بم!
چون زۆرجار بەدەم رۆیشتنەوە نووستووم..!
بۆنا..!
چوون ئێرە دۆزەخێکە لە وەرین..!

کەرکووک– 2004

پێش هاتنی پەیامی

خنکانی نێرگز

گەردوون هێند پیرۆز بوو

پەرستگاکان کڕنۆشیان بۆ دەبردو

فریشتەکان دەیان پەرست..

پێش لە دایکبوونی وەرزی راگوێزان,

من هەناسەی رۆحی گڕ بووم,

لە ئامێزی بڵێسەدا ژوانم دەگرت..

لەهاوینە مەیخانەی خاسە

پێكی مەلەم دەنۆشی..

چ شەرابێكی كۆنە ساڵ بوو..؟!

بۆنی گوندەكانی (شوان)ی لێ دەهات..

شار چەپكێ كازێوە بوو

لە سینەیدا نیگای پڕ لە رازی

ئەستێرە جووتبووەكانم دەخوێندەوە

ئیدی بەدەم مەست بوونی رۆحەوە

هەناسە ئەرخەوانییەكانی ئەو دەڤەرە

رەنگی ماچی دەگرت  و

چرۆ سەوزەكانی خۆزگەش

لە ژێر نمە بارانی ئاوێتەبوونا

لێوی پشكووتنی دەمژی..

* * *

بیرمە،

هێشتا مەمكی كریستاڵی مناڵیم دەمژی,

پەیكەری پیرۆزی گەردوون شكاو

لەژێر پێی ئەهریمەنەكانی مەرگا

بوو بە تۆزو تەمی خنکان..

تەمی راگوێزان

فیردەوسی لەئامێز گرت,

باخچە گوڵینەکان گرپیان گرت و

بوون بە قەقنەس..

دار سەرووەکان کرانە سەربازو

لە بەرەکانی شەڕا

سروشت ونی کردن..

منی رێبواری خۆری ئەوینیش

بەدەم شەپۆلە سەرشێتەکانی کۆچەوە

لە دۆزەخی نامۆیی و غوربەت گیرسامەوە..

دواتر لە بارەکانی تاراوگە

پاسەپۆرتی قەرەجیم وەرگرت..

* * *

وەلێ ئەمێستا

دوای فەنابوونی وەرزی رەهێڵەو

هەرەس هێنانی لافاوی رەشی وەیشوومە..

دوای گەڕانەوەی نەورەسی فریادڕەس

لەگەڵ پۆلی کۆترە تاراوەکانا،

لەگەڵ رۆحی مەستی چۆلەکە نەمرەکانا,

سەرمان بە ژوانە کریستاڵییەکانی شارا کردەوە,

گەڕاینەوە هەواری کەرنەڤاڵی نەورۆز،

بەنیازی منداڵ بوونەوەم

ئارەزووم کرد

ئەو بەیانییە لەگەڵ قەلأدا

هەناسەی خۆر هەڵمژم..

تا تێر تێر بەئارامی

لە کچانی شاری خۆم بڕوانم

وەلێ بێ ئاگا من

دوای مەرگی تریفەی چیا

پاییز فرمێسکە شووشەییەکانی گەڵای

بەدڕکەزییە بۆرەکانی بیابانا هەڵواسیبوو..

قەدەر شەرابی ئاسودەگی گڕی

بەدەم رووشاندنی

تابلۆی وەنەوشەیی شارەوە نۆشی بوو..

جێ ژوانی پەپوولەکان

بوو بوونە خۆڵەمێشی سوتانی مانگ و

بە دڵۆپە خوێنی زامی پیریی باوەگوڕگوڕ

هێدی هێدی

ڕۆچووبوونە جەستەی خاکەوە

بۆ مەرگی ئەم گەڕانەوەیەم

تێر تێر گریام..

چ خەمێکی گەورەیە،

لەبری گریانی من،

بۆ زیندەبەچاڵکردنی مەملەکەتی ئەستێرە

کۆلانەکان قژی بەفرینی خۆرەتاو

بۆ ڕێبواری من دەرڕننەوە!

لەبری گریانی من،

بۆ بە سەراب بوونی سیمای ڕەنگاڵەیی بەهار

قەلایەکی لانەوازی بەر ڕەشەبا

بۆ نامۆیی من دەگریێ..

چ کۆستێکی گەورەیە

دوای هەژدە پاییزی ئاوارەیی

ئەمێستا من غەریبیێکم

لە ئامێزی دایکی خۆمدا,

نەکەسێ دەمناسێتەوەو

نە من جێژوانێ شارەزام..!

کەرکووک – نیسانی 2003

لە دنیادا..

دوو (باڵدار)م هەبوو:

یەکیان ئەلفو بێی کوردی

فێرکردمو

لەمەنزڵگای نەمراندا راکشا..

ئەوی تریش,

فێری..

ئەلفـو بێی عەشقی کردمو

بە باڵای بەرزی ئاسماندا هەڵکشا..

پێش ئەوەی مەرگ بنێژرێت
زگی باخیان دڕیو
فەریکە سێویان سەربڕی..
کەڵە کێوییەکەی میری سیپان نەمردبوو,
ئاسکێک بە زیندوویی
لە سێگۆشەی خواکوڕک ون کرا..

* * *

بارانی رەش
مەملەکەتی مۆمیاکراوی (با),
جەنگەڵستانی بەفری سوور,

بە دڵۆپە فرمێسکێک نەتوێنێتەوە
چ زمانێک.. چ شایەد عەیانێک دەڵێت:
باران بووکی مەرگە؟
نەورەسێک شای ماسییەکان مارە دەکا,
هاژەو شەپۆلیش دەبنە هەنسکی دەریا..
لە شەوێکی مەرگاویدا
شاخە سەهۆڵبەندەکان
(تایتانیک)یان تێک نەشکاندبا
مێژوونوس زاتی ئەوەی نەبوو بڵێ:
عەشق لە پۆزەی هیوادا فەنا دەبێ!
خۆری روو زەرد
کەرنەڤاڵی بۆ مەرگەوەر سازنەدابا,
(گۆدۆ) مانگی دەستگیر دەکرد..
شاعیرێکی تارمایی لەدایک دەبوو,
مەم و زین گۆرانییان
بۆ مەست بوونی مانگ‌و رووبار دەچڕی!
پێ بەکۆتەکان..
(پیانۆ)یان بۆ بەر رێژنەی تەرزە پەلکێش نەکردبا,
هاورێیانی (بتهۆڤن),
(سەمفۆنیا)یان فەرامۆش نەدەکردو
عاشقی سۆزی (با)ی دەشت‌و دەر نەدەبوون!!

چ شەوێکی ئەنگوستە چاو بوو..

کە سۆزی ماچێک بوو بە مانگ..

(ڤانکوخ) تارماییەکی کردە جەستە,

(بتهۆڤن)یش ئەستێرەیەکی کردە نۆتە..

* * *

شەوێکی یەڵدا بوو..

کوندەپەپووەکەی سەرماڵی دڵ هەڵکورما,

ئەویندارێك فرمێسکی چاوی

گوڵە شەوبۆیەکی سڕی..

کوکوختییەکان گەڕانەوە

سەر پەنجەرەی دڵە مۆمیاکراوەکان..

فریشتەکان لەجیاتی خۆر

شەوی رەشیان داگیرساندو

قوژبنەکانی گەردوونیان رۆشن کردەوە..

* * *

ئەو شەوە لەگەڵ گزنگدا ژوانم هەبوو,

دەبوو لەگەڵ فرمێسکی هەناسەدا

گوڵی ئینجانەکان ئاو بدەین..

لەگەڵ شا شیعرێکی (پەشێو)دا

پەی بە رازو نهێنییەکانی

(با)ی گەڕۆك بەرین..

* * *

شیعر وتی:

(با) موژدەی شەوی سووری پێیە,

(با) بورکانەو کەژی رێگای گەڕانەوە

دەتوێنێتەوە..

(با) هەواڵی رووکردنە هەواری

پەپوولەی موسافیری لە هەگبەدایە..

ئیمشەو (با)ی پەیامبەر

لە پەنجەرەی رۆحو

دەرگای نیگا بێ نازەکەتەوە

دێتە ژووری,

ئیمشەو لێوەکانی مەرگ کڵۆم دراون,

ناتوانن لێوی پەرەسێلکە بێ ماڵەکان ماچ بکەن,

لێو بەلێوی نەورەسە عاشقەکانەوە نانێن..

* * *

منیش لەکۆتایی شیعرێکدا وتم:

ئیمشەو پیتەکان دەبن بەگەردانەی شیعر..

سەرابە تینووەکان تێر ئاو دەبن,

هەورەتریشقە باڵدەگرێ,

(با) جاڕی کەرنەڤاڵی کۆڵکەزێڕینە دەدا,

(با) سەمفۆنیای گەڕانەوە دەژەنێ..!!

بۆ قومێ سۆز

رووم کردە ماڵی (با),

دەرگای هەناسە تەلبەند بوو,

شەقامی دەریا شوشەڕێژ,

چوار دەورم حەوزی گەڵا,

خەندەی دڵ شکاندن

زامی غەریبی کولاندمەوە..

***

بۆ شیعریێ

ڕێگای ئاوم بڕی..

گەردنی پەڕەسێلکەم ماچ کرد..

(گوڵی یەخ)م بیرکەوتەوە,

تێر تێر بۆ (سوهراب) گریام..

***

بۆ دیداریێ

هەناسەی سوتاوی سارام هەڵمژی..

ڕێم کەوتە مەیخانەیەک

کەسێ نەبوو بێ دڵیم بکات..

پێک وەک نێرگز

زەردەخەنەی خەمی دەکرد..

دڵ ئەمجارەش ڕەنجەڕۆ بوو..

کە گەردەلوول لەوێشی دوور خستمەوە..

داوای چرکەیەکم لە زەمەن کرد,

قرچە قرچی ئارەقە

پرژەی دڵی ماندوو کردم..

هەڵوەشانی رەگی تەرزە

دڵی (ئەمەل)ی تەنگ کردم..

لەناو

گۆرانییەکدا

توامەوە..

***

بۆ ئامێزی بەفر گەڕام

هەناسەی کانی سوتاندمی,

ماڵی خەونەکانم هێندە دوورن

هەنسکی

تەنیایی

شەوانەش

نایانگاتیێ..!

لە دوا ساتەکانی فەنابووندا,

پەنجەرەیەك نیانی خۆی نواند..

کچی هەوری نیشاندام,

بێ ئەوەی ڕێ لە نیگام بگرێ..!

کە لێوەکانم گۆنای (سێو) دەمژن

لەرە تەماوییەکانی نیگام دەدزن,

نەفرەت لە گوناهباری و گەورەبوونی

خۆم دەکەم..

نەفرەت لەوانەی کە (سێو) دەڕوێنن..

نەفرەت لەو هەورانەی

دەبنە چەتری (سێو)..

نەفرەت لە نەمری (سێو)..

وەلێ تەلیسمی (سێو) هێند بەهێزە
گەر شەوانە پەنجەکانم لەخۆ نەگرێ,
ئەوا لەنێو پێشکەی (دەست)ما
هەڵ..
دە..
وە..
ر.. ێ.. ن..!

مەستبوونی شەقام‌و

ون کردنی کلیلی باوڵەکەی باپیرەم..

هەڵفڕینی رۆحی ئەستێرەو

دروستکردنی هێلانەیەك بۆ باران,

شێتیان کردم..

تارانی گەڵاو

نەزۆکی خەندە,

لەسینەی کۆچدا راکشان..

بەزمی رەهێڵەو

هەنسکی تۆفان,

دڵۆپێکن لە مانگ‌و

دارڕژانە نێو فەرهەنگی تەم!

ئینجانەیەك,

مافی پەنابەرێتی دەدرێتێ!

دار بەڕوویەك,

تۆمەتی زیادمەسرەفی دەدرێتەپاڵ!

کۆکینی گالیسکەیەك

بەدەم رێی دیلێتییەوە

سەمای (لەری)ی گوڵفرۆشی

بیربردمەوە..

شەوی گەڕانەوەی چرۆی تەمەنی رابردوو

فرمێسك تارای نامۆیی پۆشی,

دڵی شەراب گریا,

ماچ لەبری چی؟!

شیلەی رۆح..

سەرلەنوێ عاشق بوومەوە؟!

کەتۆم ناسی

پیتەکانی خەم

بەشەپۆلی (با)

لەسەر کەنارەکانی دڵم

هەڵ..

..کۆڵ..

..ران..

ئینجانەیەك

لە هەنسکی چاوەڕوانیم

تۆی نەهەژاند,

وەلێ رۆحی ئەهریمەنی دابڕانی خستە نزا..

(فەرەنگیس)ی ون

بەتەلیسمی نیگا رووتەکانی

کۆرپەڵەی حەزی ناخو

رەنگاڵەیی تابلۆی مامۆستاکەی هەڵپرووکاند..

تۆی بێ باکیش

بەهەڵوەراندنی چرۆی نیازو

خستنی گەرای رەشبینی,

لەمنداڵدانی داهاتووم,

لەکەناری غوربەت,

ساباتی ئەشكو تەناییت بۆ هەڵدام..

دوای ئەو چرکە سەرابییەی

هەور بەرگی وێڵی پۆشیو

حوکمی سەرگەردانی

بەسەر ئەستێرەدا سەپاند..

تۆی بووکی کیشوەری ناز,

تۆی کازێوەی هەنسکی راز,

پێکی تاڵو بێ سارێژی

سەفەرت نۆشیو

عەشقت گیرۆدەی

وێستگەکانی پشوو کرد..

مامۆستای کۆچ

گەیشتنی پەیامی کۆچت

بە جێژوانەکانی سەرچنار,

گەلا وەریوەکانی سەیوان,

لە حەژمەت ئازارو

سوتانی بەردەوامی ناخم,

ڕەگی کۆچیان بەر نەفرەتدا,

تا گەیشتە کۆچەرەکانی ئێستا..!!

ڕۆژی یەکەم..

بۆ جەنگەڵی گۆڕ دەچم,

بۆ زەماوەندی ناشتنی باران..

ڕۆژی دووەم..

پێشانگەی ون بوونی رەنگ دەدۆزمەوەو

تابلۆی رزیوی تەمەنی تیا هەڵدەواسم..

ڕۆژی سێیەم..

گوڵە, گوڵ فرۆشەکان

لەخۆ دەگرمو

مێژووی فرۆشتنی یەکەم گوڵیان

بۆ باس دەکەم..

ڕۆژی چوارەم..

سەرێکی باخەکەم دەدەم,

گەر هەستم بە تینوێتی گوڵەکان کرد

هەر لەوێوە بانگی گریان دەکەم..

بۆ تێربوونی گوڵەکانو

بۆ بوونی خۆم..

ڕۆژی پێنجەم..

پشووە..!

ڕۆژی شەشەم..

کەرنەڤاڵی وەرین دەست پێ دەکاو

منیش داوەتم..

ڕۆژی حەوتەم..

ئەو ڕۆژەیە لەدایک بووم..!!

گومان..

گوڵ ئەستێرەی تەمەنی

تواندینەوە,

پەنجەرەیەکی بۆ هەرەسی گوڵە گەنم

والآکردو

گۆزەی پڕ لە خەونی سەوزی شکاند..

گومان..

پەیڤی بەسۆزی

لە لێوکردین بە پشکۆ,

مەدالیای بێ بڕوایی

بەگەردنی خۆشبڕوایماندا هەڵواسی

کۆڕی دوا ژوانی بۆ بەستین,

شەرابی لێکدابڕانی پێ نۆشین..

زۆر بۆ شیبوونەوەی تیشکی خۆر

گریام

ئەمێستا بە دارڕژانی ئەستێرەکان

پێدەکەنم..!

* * *

کێ نازانێ,

منی کوڕی بەفری چیا,

نێرگزەجارێک..

گۆڕستانێک..

نیشتمانێک..

گەلێکم هەیەو وان لە بیابانا..؟!

# رازەکانت ئاوارەن

پەیامەکەت درەنگ گەیشت,
کاتێك گەیشت من کیشوەری خەمستان بووم,
کاتیش لەنێو ناخی تەنیاییدا تواوبۆوە..

ئازیزە نامرادەکەم,

ئینجانەی هەناسە نامۆکانی تەمەن,

ئاوازی گوڵیان

تیا ناڕوێ!

دەنا شەوانە شێتەکان

شیعری داماویان نەدەبوو!

پەپوولە بەفرینەکەی

تابلۆی بەفرستانی حەزم,

زۆر لەمێژبوو چاوەڕێ بووم,

وەلێ ساتەکانی گەیشتن,

خەزانی عەشق و شادی بوو..

وەرزی گریانی شاعیر بوو..

ئەو ساتە سوورەی

کەنار شەپۆلی نیگای لەئامێز گرت و

بە ئاوازی ڕێژنەی فرمێسك

کەوتە سەما..

ناخی تەزیووم بارمتەبوو

بارمتەی دەستی چەتەکانی خەم,

بارمتەی ڕێسا بێ ڕۆحەکانی سەردەم!

لە جەنگەڵی عەشقە خنکاوەکاندا

شەونمی دیلی چاوی گوڵی

لەخۆ دەگرت..

لێوی کۆترە سەفەرییەکانی

دەڤەری کۆچی ماچ دەکرد..

ئاخ بۆ ساتەکانی گەیشتنی پەیام..

بۆ ئەو ساتەی

سۆزە بێ دەنگەکەت رابوو

بەرەو وێستگەی مەستیم

باڵی گرت..

بۆ ئەو ساتەی

پەیڤە شەیداکانت

سێبەی رۆحو

هێشووی نامۆییان ماچ کردم..

هۆ پەپوولە رەنگاڵە گرینۆکەکە

لەرەی تارای رەشی رازەکانت

هەست پێ دەکەم,

هەست بەگریانی رۆحی تۆو

بۆنی غەریبی خۆم دەکەم..

ئاخ بۆ ئەو رازە سەرگەردانانەی

سارای مەرگ

بەدوای بارانی بووندا

پەی دەکەن..

کچە عاشقە شێتەکە

رازەکانت بێ لانەن,

بەڵام ماڵی رۆحم بارمتەیە..

نیانە تەنیاو رەنگ زەردەکە

رازەکانت ئاوارەن,

وەلێ وڵاتی دڵم وێرانەیە..!!

لە ساباتی جەنجاڵی ئەندێشەدا

هێڵ و رەنگەکان

ورێنە دەکەن و دێنەگۆ..

لێوەکان وشکیان کردووە..

ئایندە بوولێڵە..

هەر شوێنێکی نامۆ, مەنفایە,

ئێرە, ئەوێ, ئەولاتریش..

پەیامە سوتاوەکان,

لەپێناو مەرگی عاشقێک

لەبازنەی نامۆییدا

ماڵئاواییان لەگەردوون کرد..

پێش لەخاچدانی باران,

ماسی و شەپۆل

لەسێبەری گەڵایەکدا ئۆقرەیان گرت..

نزای کۆچەرە سەرهەڵگرتووەکان

گەیشتە فریشتە خنکاوەکان و

ئەندێشەی وێڵی گوڵیان گریان..

پرسەی شارێکی بێ ناونیشان

بۆ فەنابوونی خۆزگەیەکە..

سروشتی سەوزی تەمەن.. نەفرەت لەبوون دەکا..

زەنگی تەلەفۆنەکانی موحیبەت.. ژەنگ گرتوونی..

هاواری قەفەس,

لەبێ ویژدانی دەرگای حەوشە,

تراژیدیای دوا سەدەیە..

سارێژی ونی بەفرە زامدارەکان

شەوان.. گلکۆی ئەستێرەیەکی مردووە!!

لەم کەڤاڵە نامۆیەدا

خەیاڵی زام بەدوای سارێژی رۆحدا

دەگەڕێ..

دوای چەندین سەدە لە فەنابوون،

بەهرەی نیگا سەرگەردانەکان

خوناوی ماچ مەستی کردوون و

بەدوای سرەوتندا وێڵن..

گوتارەکانی عەشق

تەرمی مۆمیاکراوی پێنووسیان

ون کردووەو

بەرگەی شیبوونەوەی رستەکانیان

ناگرن..

کانی لێوە قەڵەشاوەکان,

لەداخی دۆڕانی لێوە کۆترییەکان

مانیان گرتووەو

مەرجەکانی پاشگەزبوونەوە

دەخنکێنن..

کچانی دەڤەری ئاسمان

بۆ ساتە چێژاوییەکانی هەناسە

بەڵێنەکانی باران دەبەخشنە ساراو

دوای ئامێزی کریستاڵی سەراب

دەکەون..

فرمێسکەکان هەموو کەم ئەندامن,

یەکیان دەنگی نییەو

ئەوی دیيان بێ سۆز..

هەزارانیشیان لەبەر نەبوونی کات

لەبار دەچن..!

زۆر دەمێکە گریانم دیۆ

ژانی فرمێسکم گرتووە,

وەلێ نازانم,

لە کوێ بگریم..؟!

ژوانی گریان لە کوێ بگرم؟!

چریکەی خۆشەویستی

لەم خۆرنەوازەدا,

عەودالی گۆرانییەکە

بۆنی نامۆبوونی خودی لێ نەییێت..

تەنیایی دڵی یادگارییەکان دەوروژێنێو

خەرمانەی خەم

لە سیمای نیگاکاندا دەنوێنێ..

سارێژ زامە بەسوێکانی عەشقی

خۆڵەمێشین و

لەئامێزی گومان وەڕزبووەو

پەشیمانە لەشێواندنی رەنگەکان..

سکالا لەداخی مەستی ئاو,

حەسرەتی ئاگر دەنۆشیٚ..

داڵی تارمایی لیٚ ئاڵاوەو

پیٚکی نەفرەتی دراو دەنۆشیٚ..

کانی مۆنتاژکراوە

لەتابلۆی بەفرو

هاژەی سوتان..

دوای گرفتاربوونی هەنار

وەرزی چاوەڕوانی

ماچە سەوزەکان رادیٚنیٚ..

بەئارامی

لەژیٚر سیٚبەری شیٚتبووندا

راکشیٚن..

# خەمەکان..
# لە ناخی منەوە چرۆ دەکەن

( لەو ساتەوەی بوون لەدایک بووە,
مامانەکان بەدوای ئایندەدا وێڵن )..

ئەو رۆژەی تیا لەدایک بووم

لە خواردنی لەتێ سێوو

لە جووت بوونی دوو چۆلەکە

زۆر کورتتر بوو..

*

ئەو رۆژەی خۆرگیرا

لەتە سێبەرێکی وێڵ

لەنێو تۆقلەستانی لەپم

چەپکێ خوێنی تەنیایی چنیو

دواتر وتی:

لە یەکی شوباتی حەفتاو حەوتا

ئەستێرەکان تێکرا

دارڕژانە نێو گۆڕی تریفەو

بوون بە خاڵو

لەسەر باڵی پەپوولە گیرسانەوە..

مانگ بەتەنیا

لە جەنگەڵی هەورا مایەوەو

تۆش کوێرانە بووی بە هاوڕێی..

* *

هەناسەکانی نامۆبوونم

بوورکانەکانی بەفریان خەفەکردەوەو

زەمەنی بەستووی بارانیان

تواندەوە..

زەفەریان بە ئاگر بردو

کەمانە نیانەکەی (با)یان شکاند..

کوکوختیە رووتە بەتەمەنەکان

وەسێتە پەنا هەندەکانیان

بەکاروانی سێبەرا

بۆ ماڵی ئەندێشەم نارد..

وەلێ ئەسەف

لەکاتی ناشتی تەرمی خۆر

هەموو شێت بوون..!

* * *

ئەو ساڵەی ئاگرو ئاو

لەنێو ململانێی حوکمڕانێتی گەردووندا

توانەوە,

شادی بەبێ نازی

لەکەناری رەشپۆشی دڵما گیانیدا..

هێڵەکانی سوتانی سۆمای خەونەکانم

لەهەواری رۆحی ئاگر

بەسەر زامەکانی دەریادا

گوزەریان کرد..

خۆزگەی کچە پاییزییەکانی

دەڤەری گەلا

لەنێو فنجانی کریستاڵی

فاڵچییە مۆدێرنەکاندا

خەیاڵییەك دەیخواردنەوە..

ئەستێرەیەکی شەرمن

پێش جووتبوونی لەگەڵ سروشت,

کچێنی لەگەڵ هەورا

قوماری دەکرد..

هەناسە سەرابییەکانی عەشقم

بۆ سۆراغی ژوانە رووخاوەکانی ئایندە

بە ئاسمانی گۆڕستانی ولاّتێکی داڕووخاودا

پەخش دەبوون..

ئەو رۆژگارە نەگریسانەی

خەرمانی عەشقیان پەرتەوازەکردم,

مەلی ئایندەیان تاراندم..

دڵۆپە رەشەکانی وەهم

تاڵە زەردەکانی سکالاّمیان

بۆ بازاڕی هەنگاوە پەشۆکاوەکانی یەڵداو

بۆ دووکانی بەفرە خوێناوییەکان

پەلکێش کردو

هێشووی ماچیان نامۆکردم..

نامۆ بووین..

لە نامۆبووندا تەنیا نیم,

هەموو نامۆین..

وەلیٚ هەندیٚکمان

لە نامۆبوونی خۆمان ناگەین

یا ئەوەتا لیٚی لادەدەین..

* * * *

شیعری پڕ لە تەنیایی شەوم راونا,

عەشقی نۆبەرەی کانیم سەربڕی,

تەکیە سەوزەکانی (حاجی)م روخاند,

مەیخانەکانی (مۆزارت)م تەقاندەوە,

فرمیٚسکی دەروونی پیٚنووسم تەلأقدا,

بەتۆمەتی نویٚژ,

هەناسەی تاراوی گەلأم سوتاند..

وەلیٚ ئیٚستاش چاوەڕوانم,

چاوەڕوانم

بەپیٚدەشتی سەماو

دەڤەری ئەستیٚرەو

دیوی نووستووی زەمەن بگەم..

کەچی ئەمێستا

لە دەستپێکی هەزارەی سێیەمدا

داهاتووم لە بوونم لێڵترە,

سەردەم رێی ئایندەی لیێ ونکردووم

نازانم لە کوێوە رێی بۆ دەچیێو

کامە ریێ بۆ ئەویێ دەچیێ..؟!

* * * * *

من گلەیی ناکەم لەکەس,

چون لە چرکە ساتی بوونما

بەدیمەنی قێزەونی بوون,

بەفەرمانرەوای مەملەکەتی رۆح,

بەگوناهباری گەردوونو سروشت,

رازی نەبووم

فرمێسکم رشت..

بەڵام کوا,

کوا تائێستا,

بوون پرسی بەکێ کردووە..؟!

یا کێ لە ئێمە,

بوونی بە ویستی خۆی بووە...؟!

(با) دەبینم بەرەنگ زەردی,

فرمێسك لە ئامێزم دەگریٚ..

رازەکانم دەبن بە سوتوو,

هەستێکی وێلٚ,

لەمابەینی منو زوبانمدا,

پەنجەرەیەکی ئاوەڵاکرد..

یادی سەرابی نامۆ

لەهەنسکی خەمەکانمەوە باڵی گرت..

چرۆو چرپەی عەشقی سوورم,

لەناموٚییدا هەڵوەری..

سوٚزیش لەبری ماچێ بارمتەکرا..!

ئەو شەوە مانم لەگریان گرت,

لەنێو لەپی حەسارێکدا توامەوە..

لەدەریای تاریکی غوربەتدا,

تارماییەک, سەمفوٚنیای مەریخی دەبەخشییەوە..!

ناڵەی تاوان,

لە کەرنەڤاڵی تەنیاییدا

لەگەڵ سیمای خوٚیدا, سەما دەکا..!

تریفەی کارەسات

رقو کینە لەخاچ دەدات..!

دوا پێکی توٚڵەم بینی, بەرژاوی

دەستی نزای بەرووی شووشەیەکی بەتاڵدا

والاکردبوو..

داوای بەخشینی لە ئێوارە دەکرد..

زوٚر ئەستەم بوو, ئاسمان گریا,

وەلێ توانای نەبوو

ماچێکی گەردنی بکا..!!

دوێشەو شەپۆلێكی وێڵ,

چەشنی حەزە تاراوەكانی رۆحی

پیرم,

هەروەك شیعرە وەریوەكانی

جوانی,

خۆی كرد بەدڵمداو

لەچاوەکانما بوو بە تابلۆ..!

بۆ سبەینێ..

ئەسرینی تابلۆی سۆمام

گڕی لەنجەی دوا پیشانگای بەفری

خامۆشکردو

مۆزارت پێکەکەی دەستی دامێو

ئیدی مەست بووم..!!

* * *

دوێشەو فریشتەی یادت

تریفەی عەشقی دەبەخشییەوە..

کەشکۆڵێکم کردە شانو بەدوای کەوتم,

هەروەك رۆژان بەرز فڕیو

نەیگەیشتمێ..

لەوسەرەوە, کە هاتمەوە

چەپکێ گەلآی ماچم لەرێی کۆچا کۆکردەوەو

بوو بەگلکۆ بۆ گۆڕەکەم..!!

* * *

شەوی رابردوو لەمەزاری پڕ لە شکۆی هێمن,

کەوتمە تکا,

تا کارێ بۆ منو

عاشقانی دنیا بکا..

هەر ساتێ لە تەمەن رابوورد,

لەنێو تابلۆی یادا بمرێ

(با) نەیگێڕێ لەگەڵمانا هەر یادگارێ,

چیدی بۆ رابردوو نەگریم

بۆ سبەینێ..

کوچەو کۆلآنی شار هەموو گەڕام..,

بۆ جێژوانێ,

بۆ ژێر داریێ..

تا بۆ خەونی دوێشەو بگریم..!!

**هاوین**

**لەم تۆفانی هەناسەیەدا,**

**ئاسمان رەنگی زەوی دەگریّ..!**

**بووکە بەفری چیاکانیش,**

**جوانتر لەمۆم**

**بەشەرمەوە بەسەر سینەی**

**دۆڵە فیردەوسییەکاندا دەتوێنەوە..!**

**لەم وەرزەدا,**

هەنسکی رۆحی کۆچەرم,

بارانی مەرگی پەشیمانی

بەپەیکەری برۆنزی بوونم

دەبارێنیٚ..

کوانوی دڵم خامۆش دەبیٚو

چەشنی کیشوەری بەستەڵەك

هەموو جەستەم

دەتەزێنیٚ..

## پاییز

لەم کەرنەڤاڵی سەمایەدا,

شەوە کریستاڵییەکانی ئەندێشەم,

جاویدانی بە زامەکانی رۆحم دەبەخشن..!

گەلاٌی زەردی بەختەوەریم,

باوێشك دەداو

لە سێبەری مانگدا رادەکشیٚ..!

لە هاوشێوەی ڤینۆس و باران,

حەوت ئەستێرە شیعرم

لە خاچ دەدرێ..

**زستان**

لەم کەڤاڵی بەفرەدا,

تریفەی ماچە فیردەوسییەکانم,

لە ئامێزی هەورا دەنوێ..!

نیگای شێتم,

بەدەم شنەی بارانەوە,

لە کەناری حەسرەتاوی ژواندا گڕ دەگرێ..!

**بەهار**

لەم وەرزە رەنگاڵەییەدا,

ئەندێشەی ئەرخەوانی هەستم,

لە ئامێزی فیردەوسی نێرگز دەتارێ و

لە دوورگەی سیای تاراوگە

ئۆقرە دەگرێ..!

لێوە ئاڵەکانم کاڵ دەبنەوە..

لەم وەرزە سەوزەدا,

سیمای لاویم

زەرد دەنوێنێ..!

کازێوە نێرگزییەکەی

دەریای ئەندێشەی شیعرم

وەرە,

وەرەو با لە هەواری دڵت

کەرنەڤاڵی کوڵکەزێڕینەی ئەوین

بۆ رۆحی مەستم ساز بدەم..

وەرە,

وەرەو با لە پێدەشتی سینەتا

ساباتی حەز هەڵبدەم..

وەرە,

وەرەو رامبهێنە, لە هاوڕێیەتی

بارانی ئەستێرەی سۆزو

مانگەشەوی یەڵدای زوڵفت..

وەرەو لە دەروونتا

فیردەوسی ئایندەم بۆ چێکە..

ئاشنام بکە,

ئاشنام بکە بە کانی لێوی تریفەو

جریوەی نیگای فریشتە..!

بمکە بە ئاشنای ئەو لێوانەی

لە بێ ماچییا وشك هەڵاتوون..!

بمکە بە میوانی ئەو سێوانەی

دەستەکانی حەسرەت نایانگاتێ و

پەنجەکانی تامەزرۆیی

خەونی پێوە دەبینن..

وەرەو بمکە بە رۆحی خۆت..

زەمەنێکە,

لەم کانییە وشکەی رۆحمدا،

هەناسە ئەرخەوانییەکانی مەرگ،

خۆزگە حەسرەتاوییەکانی ئەندێشەم,

بۆ دڵۆپە سۆزێ دەپشکنن

نەبادا سارای دڵم ئاوبدا..

زەمەنێکە,

لەم دەربەندە بارمتەیەی نیگام

ئەسرینی سوری خەمێ،

لە گۆنای مەستی چاوەڕوانیم دەڕوانێ..

نەبادا لە کەناری سۆمای ڕێبواریێ

بە وێستگەکانی پشوو بگا..

زەمەنێکە,

خووم بە گەمەی سێوەوە گرتووە..

لەنێو دێری تویێکڵەکانیا

مەملەکەتێک دەهەژێن و

مەملەکەتێک دەتوێنەوە..

ئەوەتا هەناسەم

بۆنی مەرگی عەشقی لێ دێ و

لە چاوەکانیشما

فەزایەک خەوتووە..

زەمەنێکە,

لە زیکری هەورەکاندا کۆیلەم و

نهێنییەکانی زەردەپەڕ

لە مەرگی بارانەوە دەبینم،

ئیدی وەسێتی زەمەنە نامۆکان دەهۆنمەوەو

شەوان گوێ لە ناڵەی قەدەر دەگرم..

نێرگزی مەست

نزای بۆ شاری خۆر دەکرد..

هەناسەی لێڵی کانی عاشقان,

حەزی پڕ تەلیسمی

بە ئاسمانی ولاٌتی تەماویدا

پەخش دەکرد..

کۆلاٌنەکانی شار نامۆبوون,

نامۆ بەو ڕێبوارانەی تا دوێنێ بوو

لە ئامێزی ئەو شارەدا

ژوانیان دەگرت..

نامۆ بەو پەپوولانەی

لە مانگەشەوی ئەو شارەدا

لەدایکبوون..

نامۆ بەو گەڕەکە تاساوانەی

شاریان پێکدەهێنا..

گەردوون لەگەڵ بارانی رقدا

ژوانی هەبوو،

دەبوو ئەو رۆژە

پێکی مەستی بنۆشێ و

جارێ بێ ئاگایی خۆی بدا..

چرکەکان هێندە تینووی زەردەپەڕ بوون

چاوەڕێی ئێوارەیان نەدەکرد,

تا ئێشکگری بەیەک بسپێرن,

ماڵئاواییان لە بوون دەکرد..

هەورە لێخنەکان

بۆ شڵقاندنی بێ دەنگی

شارەزوور بەڕێوەبوون..

کات توورەبوو,

چرکەکانی هەموو جێهێشت..

کات تەواو بوو،

گۆران گریا.. هاواری بوو

وەلێ کەسێ نەبوو چاوی بسڕێ و

لە هەڵەبجەی گۆڕا دەری بێنێ..

کات تەواوبوو،

هەناسە یاخی بوو,

ئیدی سەفەری ولاّتی رۆحی نەکرد..

کات تەواو بوو،

پێنج هەزار چرکەی سەوزو سوور

لەنێو کاتژمێری شارێکدا خنکان..

پێنج هەزار پێکی خوێن،

پێنج هەزار رۆحی سپی

لەنێو دیوانە شیعرێکدا

بوون بە پەیکەر،

مەرگ خۆی بەر نەفرەتدا..

هەر ئەو پایزە شەوەی

خەیام داوەتی کردم

بۆ ئامێزی شۆخێک..

سنورەکانی گێتیم گشت بڕی

بۆ مژینی لێوی فریشتەیەک..

ئەستێرە نەما پەی پێ نەبەم,

تەنانەت سەرێکم لە کیشوەری ماچیشدا

هێدی هێدی گەڕامەوە

خۆم ون نەکرد..

وەلێ ئەو رۆژەی پێکی ئەوینی تۆم نۆشی,

لە دوورگەی چاوەکانتا ون بووم,

ئیدی نەگەڕامەوە..

**1**

کاتێ لە ئامێزتا
شەوم دەکرد بە رۆژ
بیرم دەکردی..
ئەی ئەمێستا چی بکەم گوڵم
چەندان شەو بکەم بە رۆژ
بەتۆ ناکەم..؟!

**2**

بۆ بۆنی هەناسەت گوڵم:
سینەی ئەستێرە چووم,
ساباتی کچە بەفرینەکان چووم,

پارکی ماچیش چووم, هەر نەبوو..!
ئیدی ئاوێزانی ئاوێزان بوونی یادی تۆ بووم و
لەگەڵ هەناسە مۆمیاکراوەکانت ژوانم گرت..!
وەلێ ماچم نەکرد..!!

3

رۆحە گوڵینەکەی رۆژانی بەختەوەریم
نەکەی قژی شیعرەکانم ببڕی,
چون ئێمە سالانێکە ئاوێزانین,
کە تەنیا بووین رووت دەبینەوە..!

4

زۆرن ئەوانەی چەشنی تۆ
بە مەرگی بەردەوامی هەناسەم
پێ دەکەنن و
بۆ لەدایکبوونی رۆحیشم
پرسە دەگێڕن..

5

گەر تۆ ئەنفالی تریفەی هەورەکان بی,
نوێژی باران بۆ کێ بکەم..؟
گەر ئاسمانیش لە رۆحی تۆ بچێ,
ئیدی من خۆزیای فڕین بۆ بکەم..؟!

6

بەهارێ گوڵە مێلاقەیەك پێی دەوتم
دەتکەم بە شاعیرێ,
تا شەوانە لە ئامێزتا شیعرم بۆ بڵێی,
گەر رەهێڵەش لە ئامێزتی دابڕیم,

لە ئامێزی شیعرەکانتا دەنووم..
کرێوەی بێ ئەمەك تۆ لە کوێی
کە لەم پاییزە شەوەدا
شیعر بۆ تەنیایی دەڵێم..؟!

7

گەر رۆژێ یارم سەفەری بکردبا,
شەوەکەی تا کازێوە
لە ئامێزی کریستاڵیا دەیلاواندمەوە
سەدەها گوڵەماچی
بۆ سەبووری دوای سەفەری
لە هەواری لێوما دەڕواند..
وەلێ ئەو رۆژەی کۆچی کرد
جیا لە جاران,
تەنانەت ماڵئاوایشی لێ نەکردم..!

8

وا هەست دەکەم
رۆحم لە زەمەن یاخی بووە,
نایەوێ لە پەرستگاکانی گەردووندا
کڕنۆش بۆ نامۆبوون بەرێ..
وەلێ زۆر لەمێژە زەمەنیش,
گیرۆدەی رۆحی من بووەو
بە شیبوونەوەی هاوکێشەی بوونم
خۆشبەخت دەبێ..

9

چ لە ژیانێ بکەم,

کە سەرچاوەی بێزاری بێ و
بەدوای پەنجەرەی هەڵاتندا وێڵبێ..؟!
من لەمەودوا بۆ سووتانی پەپوولەکان
ناگرییێم..
چون ئەوان لە ئاگرا لەدایک بوون..!
ئەستێرەکان هەموو تێکڕا
لەگەڵ دڵۆپە بێلانەکانی باراندا
سەرگەردان بن,
من ناهەژێم..
چون ئاسمان خۆی سەرگەردانی سەرگەردانییە..!
هەرچی گوڵی پەمبەو ئاڵە
لەگەڵ توانەوەی کۆڵکەزێڕینەدا هەڵبوەرێن,
با هەڵوەرێن,
چون گەردوونیش گەڵایەکی هەڵوەریوە..!!

**10**

خەمەکانم هێندە زۆرن
شەوان هەموو کۆدەبنەوە
هەریەک باسی بەسەرهاتو
زامی دەروونی خۆی دەکات
منی نامۆو سەرگەردانیش
هەروەک پیشەی هەموو شەوم
بە مشتێ فرمێسکی نیگا لێڵەکانم
خەمێکی نوێ دەنووسمەوە..!

# وریابە لە یاخیبوونما یاخی نەبی!

وریابە لە یاخیبوونما یاخی نەبی

پێشکەشە بەو کۆچەرەی
دەیەوێ لە یاخی بوونم بدوێ

